

# دوعاکانی قورئان

پێداچوونەوەی

حەمزە بەرزنجی

١٤٤٥ھ




بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمدلله واصلاة والسلام على رسول الله وعلـى اله وصحبه ومن والاه ...وبعد**

**دوعاو پاڕانەوە یەکێکە:** لە گەورەترین جۆرەکانـــی عیبادەت و بەهێزترین پەیوەندی نێوان بەندەیە لەگەڵ بەدیهێنەر و پەروەردگاری.. کە بە هۆیەوە کزۆڵی و ئاتاجی خۆی ڕادەگەیەنێت و داوا و هەژاری خۆی دەگەیەنێت و هەردەم دڵ خۆشـــە بەوەی ئەو خاوەنە بەدەســەڵات و بەهێزە ئاگای لێیەتـی و بە هانایەوە دێت و فریای دەکەوێت، خۆ ئەگەر بە جوانـــی پاڕایەوە و ڕەچاوی کات و شـوێنەکانـــی گیرا بوونـــی پاڕانەوەکانـــی کردو بەو مەرج و ئەدەبانە پاڕایەوە کە دیاری کراوە بە دڵنیاییەوە خوای پەروەردگاری بە بەزەیـــی و میهرەبانـــی خۆی وەڵامی دەداتەوە..

**بـاشـــترین جۆری پـاڕانەوەش** ئەو پـاڕانەوانەن کە لە قورئـان و فەرمودەکاندا هاتوون...

**ئەم نامیلکەیەی بەر دەســتیشــت** ئەو دوعا و پارانەوانەی لە خۆ گرتووە کە لە قورئانـــی پیرۆزدا هاتووە لەگەڵ ماناکانیان بە کوردی، سوود لە تەفسیری تەوحید وەرگیراوە بۆ تەفسیری ئایەتەکان.

**لە خوای گەورە داواکـارم** چێژی پـاڕانەوەو دوعـامـان پێ عەتـا بفەرموێت...وە لە الله سـبحانە وتعالـــی داواکارم ئەم کارەمان لـــێ وەربگرێت لە تەرازووی چاکە کەمەکانماندا بۆمان حساب بکات..







﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾




﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ الفَاتِحَة (٦)

**(پەروەردگارە) ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست.**




﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ
مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ البَقَرَة (١٢٦)

**خودایە ئەم شارە بکەیت بە شارێکی هێمن و لە بەروبوومەکان ڕۆزی خەڵکەکەی بدە، ئەوانەیان کە باوەڕیان بە خودا و بە ڕۆژی قیامەت هێناوە.**









﴿رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٢٧﴾ البَقَرَة (١٢٧)

ئەی پەروەردگارمان لێمان وەرگرە بەڕاستی تۆ بیسەر و زانەری.




﴿رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١٢٨﴾ البَقَرَة (١٢٨)

ئەی پەروەردگارمان دوعامان وەرگرە، وە بمانگێڕە بە ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانت و بمانکە بە دوو موسڵمانی چاك و پاك و وا مان لێ بکە کە تەنها بۆ تۆ گەردنکەچ بین، لە نەوەی ئێمەش گەلێکی موسڵمان سەوز بکە، وە شێوە و جێگای عیبادەتمان پێ پیشان بدە کە چۆن عیبادەتت بکەین و تەوبە مان لێ وەرگرە بەڕاستی ئەی خودایە تۆ زۆر تەوبە وەرگرێکی بە سۆزی.










﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ البَقَرَة (٢٠١)

**خودایە لە دنیادا چاکەمان بدەرێ و لە قیامەتیشدا هەر چاکەمان بدەرێ و بمانپارێزە لە سزای ئاگر.**




﴿رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ البَقَرَة (٢٥٠)

**ئەی پەروەردگارمان لافاوی خۆگری و ئارامی بڕژێنە بەسەرماندا و پێیەکانمان محکەم و پتەو بکە کە ئۆقرە بگرین و یارمەتیمان بدە و زاڵمان بکە بەسەر گەلی کافراندا.**






﴿غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾ البَقَرَة (٢٨٥)

**(پەروەردگارە) داواى لێخۆشــبوونت لێدەكەین و هەر بۆلاى تۆشە سەرئەنجامەمان.**




﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ
إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا
لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا
فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ البَقَرَة (٢٨٦)

**ئەى پەروەردگارمان لۆمەمان مەكە لەسـەر ئەو شـتانەى كە لە بـیـرمـان چـووبـێـتـەوە یـان بە هەڵە كـردبـێـتـمـان، ئەى پەروەردگارمان بارى گران مەدە بە ســەرماندا وەك ئەو بارە گرانەى كە داوتە بە ســەر ئوممەتـانـــى پێش ئێمەدا، ئەى پەروەردگارمان نەیدەیت بە سەرماندا ئەوەى كە لە توانامان دا**









نـــیـــیه و چاوپۆشـیمان لێ بکه و له تاوانەکانمان خۆش ببە و ڕەحممان پێ بکە، بەڕاسـتـــــی هەرخۆت سـەرپەرشــت و یارمەتیدەرمانـــی، سا خودایه یارمەتیمان بدە و بەسەر گەلـــی کافراندا سەرمانبخە.




﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ۝٨﴾ آل عمران (٨)

ئەی پەروەردگارمان دڵەکانمان لا مەدە لە ئایـــــین پاش ئەوەی کە هیـدایەتـت داین و ڕێنمـایـت کردین، وە لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەت و سۆزمان پێببەخشە بێگومان تۆ هەر خۆتیت بەخشندە.















﴿رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

آلِ عِمۡرَان (١٦)

ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە سا لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە سزای ئاگر بمانپارێزە.




﴿رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾

آلِ عِمۡرَان (٣٨)

خوایە لە بار خانەی خۆت ئەولادێکی پاك و خاوێنم پێ بدە بێگومان کە تۆ بیسەری ئەم نزایەی منی.

















﴿ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٥٣ ﴾ آل عمران (٥٣)

ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی کە تۆ ڕەوانەت کردوە و شوێن ئەم پێغەمبەرە کەوتووین دەی بمان نووسە لە ڕیزی ئەو کەسانەی کە شایەتن.



﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ آل عمران (١٤٧)

ئەی پەروەردگارمان لە تاوانەکانمان خۆش ببە، وە لە زێدەڕۆیی و کاروبارمان خۆش ببە، وە پێکانمان بچەسپێنە و یارمەتیمان بدە و سەرمان بخە بە سەر گەلی کافراندا.













﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

آلِ عِمْرَان (١٩١)

ئەی پەروەردگارمان ناگونجێت تۆ ئەمەت (ئاسمانەکان و زەوی) پوچ و بێهودە دروست کردبێت پاك و بێگەردی بۆ تۆ کە ئیشی بێ کەڵك و بێ حیکمەت بکەیت، دەی بمانپارێزە لە سزای ئاگر.



﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ
فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ
ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾ آلِ عِمْرَان (١٩٣ - ١٩٤)

ئەی پەروەردگارمان بێگومان ئێمە دەنگی ئەو کەسەمان














بیســـت کە بـانگی کرد بۆ ئیمـان و دەیوت: بـاوەڕ بهێنن بە پەروەردگارتان، جا ئێمەیش باوەڕمان هێنا، ئەی پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان خۆشــبە و تاوانەکانمان بۆ داپپۆشــە و لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنە(١٩٣).

ئەی پەروەردگـارمـان دوعـامـان وەرگرە و پێمـان بـدە ئەو بەڵێنەی کە لەســەر زاری پێغەمبەرەکـانت داوتە، وە لە ڕۆژی قیامەتدا ســەر شــۆڕمان نەکەیت بێگومان کە تۆ پێچەوانەی بەڵێنـی خۆت ناکەیت(١٩٤)..




﴿رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ النِّسَاءِ (٧٥)

ئەی پەروەردگارمان دەرمان بکە لەم شــارەی مەککە کە خەڵکەکەی ســتەمکارە و دەســا ئەی خودایە لە لایەن خۆتەوە دۆستێکمان بۆ بنێرە و لە لایەن خۆتەوە یارمەتیدەرێکیشمان بۆ بنێرە.














﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨٣﴾ المَائِدَة (٨٣)

**ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە جا تۆش تۆمارمان بکە لە ڕیزی ئەو کەسانەی کە شایەتن.**



﴿رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ الأَعۡرَاف (٢٣)

**ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە ستەممان کردوە لە خۆمان و ئەگەر تۆ لە گوناهمان خۆش نەبیت و ڕەحممان پێ نەکەیت سوێند بە زاتت ئەو کاتە ئێمە لە کۆمەڵی ڕەنجەڕۆیان دەبین.**

















﴿قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ الأعراف (٤٧)

**ئەی پەروەردگـارمـان هەرگـیـز لە ڕیـزی ســـتەمكـارانـدا حیسابمان مەكە.**



﴿وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ﴾ الأعراف (٨٩)

**عیلمی پەروەردگارمان بە سەر هەموو شتێكدا بڵاوبووتەوە و بە هەموو شتێك بە ئاگایە، هەر پشتیشمان بەو بە ستوە، ئەی پەروەردگارمان ئێمە و گەلەكەمان بەڕاستی لەیەك جیابكەرەوە تۆ چاكترینـی جیاكەرەوەكانـی.**












﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ﴾ الأعراف (١٢٦)

**ئەی پەروەردگارمان لافاوی سەبر بڕژێنە بە سەرماندا و بە موسڵمانیش بمانمرێنە.**




﴿سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ الأعراف (١٤٣)

**خودایە پاکوخاوێنی هەر بۆ تۆیە و من گەڕامەوە بۆ لای تۆ و پەشیمانم لەوەی کە وتومە و من یەکەمی باوەڕدارانی ئەم گەلەم.**






﴿لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾

الأعراف (١٤٩)

بەڕاستی ئەگەر پەروەردگارمان ڕەحممان پێ نەکات و لێمان خۆش نەبێت ئەوە ئیتر بێگومان ئێمە لە ڕیزی زیان لێکەوت و ڕەنجەڕۆیاندا دەبین.




﴿رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾

الأعراف (١٥١)

ئەی پەروەردگارم لە من و لە براکەم خۆشبە و بمان خەرە ناو ڕەحمەت و سۆزی خۆتەوە و تۆ لە هەمووو بە ڕەحم و بەسۆزەکان بە ڕەحم و بەسۆزتری.






﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ﴾ الأعراف (١٥٥)

فەرمووی: سا چاوپۆشیمان لێ بکە و بەزەییت بێت پێماندا، وە تۆ چاکترینی هەموو چاوپۆشیکەرانی.




﴿حَسۡبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ التوبة (١٢٩)

هەر ئەو خودایەم بەسە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە جگە لەو، وە من تەنها پشت بەو دەبەستم و هەر ئەو بە پشت و پەنای خۆم دەزانم، وە هەر ئەوە پەروەردگاری عەرشی گەورە.






﴿فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

يُونُس (٢٣)

**ئەوانــیش وتیان: تەنها پشت بە (الله) دەبەستین، دەی ئەی پەروەردگــارمــان ئـێـمە نەکەی بە هــۆی گــومــڕا بــوون و تاقیکردنەوەی گەلـی ستەمکار.**




﴿عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٥ وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٦﴾ يُونُس (٨٥ - ٨٦)

**ئێمە تەنها بەخوا پشـــت ئەســتوورین و، کاری خۆمان دایە لای ئەو، ئەی پەروەردگار مە مانخەرە بەرفیتنەو تاقییکردنەوە لەبەر دەستی هۆزو گەلی ستەمکاراندا، تا زاڵ نەبن بەسەرمانداو، لەدین وەرمان نەگێڕن(٨٥).**

**- بە میهرەبانـــی خۆیشـــت لەدەســـت هۆزی بێ بڕوایان - فیرعەون و تاقمەکەی ئەو- رزگارمان بکە(٨٦).**

٢٩

﴿رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي
وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ هُودٍ (٤٧)

**ئەی پەروەردگـارم بێگومـان پەنـات پێـدەگرم کە داوای شتێکت لێبکەم زانـیاریم لەبارەیەوە نەبێت، بەڕاستی ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبـــی و ڕەحمم پێ نەکەی ئەوە من لە ڕیزی ڕەنجەڕۆیان و زیان لێکەوتوان دەبم.**



٣٠

﴿۞ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ
فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي
مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ١٠١﴾ يُوسُفَ (١٠١)

**ئەی پەروەردگارم بێگومان کە تۆ پاشـــایەتی و مالیکیەتی میسرت بە من بەخشـــی و منت فێری لێکدانەوەی خەونەکان کرد، ئەی دروســتکەری ئـاســمـانـان و زەوی تۆ دۆســـت و**

سەرپەرشت و یارمەتیدەری منی لە دنیا و پاشەڕۆژدا، دەی بە موسڵمانی بممرێنە و بمگەیەنە بە پیاوچاکانیش.




﴿ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ
ٱلۡأَصۡنَامَ ﴾ إبراهيم (٣٥)

ئەی پەروەردگارم ئەم شارە بکە بە شارێکی هێمن و پڕ ئەمن و ئاسایش، وە خۆم و کوڕەکانم دوور بخەرەوە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.




﴿ رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ
٤٠ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ٤١
﴾ إبراهيم (٤٠ - ٤١)

ئەی پەروەردگارم من وا لێ بکەیت کە بە ڕێکوپێکی نوێژەکانم ئەنجام بدەم، وە لە نەوەکانیشم کەسانێك هەبن کە

به ڕێکوپێکی نوێژەکانـــیان بکەن، ئەی پەروەردگارمان دوعا و نزاکانمان لێوەرگرە(٤٠).

ئەی پەروەردگارمان لەو ڕۆژەی کە حیســاب و لێکۆڵینەوە بەرپا دەبێ، لە من و لە بـاوك و دایكم و هەموو بـاوەڕداران و خۆشببە و چاوپۆشیمان لێ بكە(٤١).



﴿رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴾ الإسراء (٢٤)

ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە (بە دایک و باوکم ) وەك چۆن ئەوان ڕەحمیان بە من کردوە و بە منداڵی پەروەردەیان کردوم.



﴿رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا﴾ الإسراء (٨٠)

ئەی پەروەردگارم بە چوونەژورێکی باش بمخەرە نێویەوە و

به هاتنه‌ده‌رێكی باشیش بمهێنه‌ده‌ره‌وه، وه له‌لایه‌نـــی خۆته‌وه هێز و یارمه‌تیده‌رێكم بۆ بڕه‌خسێنه. كه بتوانم به‌سه‌ر دوژمنانی ئاییندا زاڵ ببم.



٣٥

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةً وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدًا﴾

الكهف (١٠)

ئه‌ی په‌روه‌ردگـارمان له‌لایه‌ن خۆته‌وه ڕه‌حمه‌ت و ســۆزی خۆتمان بۆ بنێره و ئه‌وه‌ی كه خه‌یری ئێمه‌ی تێدایه بۆمان بكه. و سه‌رئه‌نجامی ئه‌م ئیشه‌مان به خێر و چاكه كۆتایـی پێبهێنه.



٣٦

﴿وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾ مريم (٦)

په‌روه‌ردگاره وای لێبكه‌یت كه په‌سه‌ند و خۆشه‌ویست بێ. لای تۆ و لای چاكه‌كاران.




﴿رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ٢٦ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨﴾ طه (٢٥ - ٢٨)

**ئەی پەروەردگارم دڵم فراوان بکە(٢٥).**

**ئەی پەروەردگارم ئەرکەکەم بۆ ئاســـان بکە. تاکو بتوانم بە باشی ئەنجامی بدەم(٢٦).**

**هەروەهـا ئەو گـرێـیەی کە بە زمـانـمەوەیە بـیـکـەرەوە و قسەکردنم بۆ ئاسان بکە(٢٧).**

**ئەوان بە چاکی لە قسەکانم تێبگەن(٢٨).**




﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا﴾ طه (١١٤)

**ئەی پەروەردگارم زانیاریم بۆ زیاد بکە.**



## ٣٩

﴿إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾

﴿الأنبياء﴾ (٨٣)

**ئەو کاتەی کە بانگی پەروەردگاری کرد و وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان کە من دوچاری زیان بووم لە ماڵ و لە لەشمدا خۆ تۆیش لە هەموو خاوەن سۆزەکان بەسۆزتری.**




**بەڕاستی ئەی خوایە جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە و پاکی و بێ عەیبی بۆ تۆیە بەڕاستی من لە کۆمەڵی ناحەقان بووم. و ناحەقی و ستەمم کرد.**














﴿ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴾ الأنبياء (٨٩)

**ئەی پەروەردگارم بە تەنیام مەهێڵە، وە هەر خۆتی باشترینی میراتگران.**




﴿ قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١١٢ ﴾ الأنبياء (١١٢)

**وتی: ئەی پەروەردگارم بە حەق و دادپەروەری بڕیار بدە لە نێوانماندا، وە پەروەردگاری ئێمە ڕەحمانە و هەر لەو داوای یارمەتی دەکەین لەسەر ئەو قسانەش کە دەیکەن.**









﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ۝٢٩﴾

المؤمنون (٢٩)

بڵێ: ئەی پەروەردگـارم لە شــوێنێکی بە پیـت و بەرەکەت دامبەزێنە، خۆ تۆ چاکترینـی هەموو مێواندارانی. و من مێوانـی خۆتم و چاوەڕوانی چاکترین و خۆشترین جێگات لێدەکەم.




﴿رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٩٤﴾ المؤمنون (٩٤)

ئەی پەروەردگارم من لەناو ئەو ستەمکارانەدا دامەنێ.



















﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ
أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾﴾ المؤمنون (٩٧ - ٩٨)

**بڵێ: ئەی پەروەردگارم هانات بۆ دەهێنم لە وەســـوەســـە و دەنەدانـی شەیتانەکان(٩٧).**

**ئەی پەروەردگارم پەنات پێ دەگرم و هانات بۆدێنم کە ئەوانە بێنەلام و لێم نزیك ببنەوە.و دەست بخەنە ناو کاروبارمەوە(٩٨).**




﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾

المؤمنون (١٠٩)

**ئەی پەروەردگـارم بـاوەڕمـان هێنـاوە، دەســـا تۆش لێمان خۆشبە و ڕەحممان پێبکە، وە تۆ لە هەموو خاوەن بەزەیـــیەکان بە بەزەیـی و بە ڕەحم تری.**















٤٧

﴿وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١١٨﴾

المؤمنون (١١٨)

**بڵێ: ئەی پەروەردگارم لێم خۆشــبە و ڕەحمم پێبکە، چونکە تۆ لە هەموو خاوەن بەزەییەکان بە بەزەیی و بەڕەحمتری.**



٤٨

﴿رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾

الفرقان (٦٥)

**ئەی پەروەردگارمان لە سـزای دۆزەخ لامان بدە کە بێگومان سزاکەی ئەچەسپێت بە مرۆڤەوە و لێی جیا نابێتەوە.**















٤٩

﴿رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ الفُرقان (٧٤)

**ئەی پەروەردگارمان هاوسەران و وەچەیەکمان پێ ببەخشە کە دڵخۆشکەر و چاورۆشنکەرەوە بن بۆمان و وامان لێ بکەیت کە بۆ پارێزکاران پێشەوا و چاولێکراو بین.**



٥٠

﴿رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ۝٨٣ وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ۝٨٤ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨٥﴾

الشُّعَراء (٨٣ - ٨٥)

**ئەی پەروەردگارم دانایـــــیم پێ ببەخشـــە و بمخەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە.(٨٣)**

**وە وام لێ بــکەیت کە لەناو خەڵکانی تریشدا ناوم بە چاك**










ببرێت. تاکو خەڵك زۆرتر لێم نزیك ببنەوە و پەیامەکەم وەرگرن(٨٤).

وە بمکە بە میراتگری باخچەی پڕ لە نیعمەتی بەهەشتیش(٨٥).


٥١

﴿وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ٨٧﴾ الشُّعَرَاءِ (٨٧)

(ئەی پەروەردگارم) وە لەو ڕۆژەی کە خەڵك زیندو دەکرێتەوە شەرمەندە و شەرمەزارم مەکە.


٥٢

﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهۡلِي مِمَّا يَعۡمَلُونَ ١٦٩﴾ الشُّعَرَاءِ (١٦٩)

ئەی پەروەردگارم من و خاووخێزانم ڕزگار بکە لە سزای ئەو کارە پیسەی کە ئەوان دەیکەن.









## ٥٣

﴿ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾

النَّمْل (١٩)

ئەی پەروەردگـارم ڕام و ڕاگیرم بکە و بۆم بڕەخسـێنە بۆ ئەوەی بتوانم سوپاسی ئەو نیعمەتە گەورەیەت بکەم کە داوتە بە من و بە باوك و دایکم، وە وام لێبکە کرداری چاکی وا بکەم کە تۆ پێی ڕازی بیت، وە بە سۆز و بەزەیـی خۆت بمخەرە ناو بەندە چاکەکانتەوە.









﴿ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ القَصَص (١٦ - ١٧)

**ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لە خۆم کرد دەسا لێم ببورە، جا پەروەردگاریش چاوپۆشی لێکرد، بەڕاستی ئەو زۆر لێبوردە و خاوەن سۆزە (١٦).**

**وتی: ئەی پەروەردگارم لە بەرامبەر ئەو نیعمەتەی بە منت داوە بەڵێن بێت منیش هەرگیز نەبم بە پاڵپشتی تاوانباران(١٧).**




﴿ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ ﴾ القَصَص (٢١)

**ئەی پەروەردگارم لەم گەلە ستەمکارە ڕزگارم بکە.**
















﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ٢٤﴾ القَصَص (٢٤)

**ئەی پەروەردگارم بێگومان من نـــیازمەندی هەر چاکەیەکم کە بۆم بنێریت.**




﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٣٠﴾ العَنكبُوت (٣٠)

**ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدە و ســەرم بخە بەســەر ئەم گەلە خراپەکارەدا.**




﴿رَبِّ هَبۡ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١٠٠﴾ الصَّافَّات (١٠٠)

**ئەی پەروەردگارم کوڕێکم پێبدە لە پیاوچاکان بێ.**







٥٩

﴿قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ
ٱلۡوَهَّابُ ٣٥﴾ ص (٣٥)

ئەی پەروەرگارم لێم ببورە و دەسەڵاتێکی وام پێببەخشە کە لەپاش من نەشێ بە کەســی تری بدەیت، بێگومان کە تۆ هەر خۆتیت بەخشندە.


٦٠

﴿رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ
سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ٧ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ
ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ
إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٨﴾ غافر (٧ - ٨)

ئەی پەروەردگارمان بەزەیــی و زانــیاریت هەموو شتێکی لەخۆگرتوە و هیچ شــتێك بێبەش لە ســۆزی تۆ نەبووە و هیچ شـتێکیش لە دەرەوەی زانــیاری تۆ نــیــیە و هەموو شـتێك










دەزانـــیت، دەسا لەو کەسانەیش ببورە کە لە تاوان پەشیمان بوونەتەوە و شـــوێن ڕێگاکەی تۆ کەوتون و لە ســـزای دۆزەخ بیانپارێزە(٧).

ئەی پەروەردگـارمـان هەروەك لـێـیـان دەبـوریـت ئـاواش بیـانخەرە نـاو ئەو بـاخـاتە هەمیشـــەییەی کە بەڵێنت پێداون، هەروەها ئەو کەســـانەی کە چاکەکار بوون لە باو و باپیران و هاوســـەران و منداڵ و نەوەکانیان ئەوانیش لەگەڵیاندا بخەرە بەهەشـــتەوە، بەڕاســـتی دەســـەڵاتداری لێزان و کاربەجێ هەر خۆتـی.




﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ١٥﴾ الأحقاف (١٥)

ئەی پەروەردگارم وام لێبکە کە سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم کە داوتە بە خۆم و بە باوك و دایکم و ئیشی وام بۆ بڕەخسێنە کە










تۆ ڕازی بکات و منداڵەکانیشم بۆ چاك و صاڵح بکە، بێگومان من بۆ لای تۆ گەڕاوەمەتەوە و بێگومان لە موسڵمانانم و گەردنکەچی فەرمانتم.



٦٢

﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ ١٠﴾ القمر (١٠)

جا ئەویش هانای برد بۆ پەروەردگاری و وتـی: بەڕاستی من شکستم خواردوە، دەسا تۆڵەم بۆ بستێنە سەرکەوتووم بکە.



٦٣

﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ الحشر (١٠)

ئەی پەروەردگارمان لە ئێمە و لەو برایانەشـمان ببورە کە لە پێش ئێمەدا بوون، وە لەناو دڵماندا هیچ ڕق و کینێك بەرامبەر بە باوەڕداران دامەنێ، ئەی پەروەردگارمان بێگومان کە تۆ زۆر دڵسۆز و میهرەبانـیت.















﴿رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٤ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٥﴾

المُمْتَحَنَة (٤ - ٥)

**ئەی پەروەردگارمان هەر پشتمان بە تۆ بەستوە و تەوبە و گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە و سەرئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە(٤).**

**ئەی پەروەردگارمان ئێمە نەکەی بە هۆی گومڕا بوون و تاقیکردنەوەی گەلی ستەمکار و زاڵیان نەکەیت بە سەرماندا تاکو وا بزانن لە سەر حەقن، جا ئیتر هەم ئێمە ئازار بدەن و هەم خۆیان زیاتر گومڕا بن، وە چاوپۆشیمان لێبکە ئەی پەروەردگارمان، بێگومان کە هەر تۆیت دەسەڵاتدار و کاربەجێ(٥).**












## ٦٥

﴿رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾

التحريم (٨)

**ئەی پەروەردگارمان ئەم ڕووناکیەمان بۆ تەواو و بەردەوام بکە تا دەگەینە جێگای مەبەست و لێمان ببورە، بێگومان کە تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.**



## ٦٦

﴿رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ
وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ التحريم (١١)

**ئەی پەروەردگارم لە لای خۆت ماڵێکم بۆ چاك بکە و لە فیرعەون و کردەوە ناپەسەندەکانی ڕزگارم بکە و لە گەڵی ستەمکار ڕزگارم بکە.**











## ٦٧

﴿ رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيۡتِيَ مُؤۡمِنٗا وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارَۢا ٢٨ ﴾ نوح (٢٨)

ئەی پەروەردگـــار لە خـــۆم و لە دايـــك و باوكيشـــم و لەو بـــاوەڕدارەی كە دێـــتە مـــاڵم و هەروەهـــا لە هەمـــوو پيـــاوان و ئافرەتانـــی بـــاوەڕدار خـــۆش بە، وە ســـتەمكارانيش جـــگە لەوەی كە لەناويـــان ببەيـــت هـــيچ شـــتێكی تريـــان لەگەڵـــدا مەكە.



لە الله ســـبحانە وتعالـــی داواكـــارم ئەم كارەمـــان لـــێ وەربگرێـــت لە تەرازووی چـــاكە كەمەكانمانـــدا بۆمـــان حســـاب بكات..

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم**


﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ
أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟
لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ١٨٦ ﴾
البقرة (١٨٦)